# بسم الله وبە نستعین

لە ساڵانی ڕابردوودا بەهۆی دەرکەوتنی ڕەوتێک لە وڵاتانی ئیسلامی بەناوی مەدخەلیەکان کە شوێنکەوتەی ربیع بن هادي المدخلي الجهمي-ن هاتن لەژێر ناوی مەنهەجی ئەهلی سوننەدا بابەتی هەبوونی عوزر بە جەهلیان لە کوفر و شیرکی گەورە و ئاشکرادا زیندووکردەوە و فراوانیان کرد تا ئەوەی بتوانن لەو ڕێگەیەوە وەلی ئەمرە عەلمانی و دیموکراسی خوازەکانیان بپارێزن لە تەکفیرکردن و جیهادکردن لە دژیان و بەرهەڵستی کردنیان بەبیانووی ئەوەی جاهیلن، بەڵام هەر زوو لەلایەن ڕەوتێکی ترەوە لەژێر ناوی جیهاد-ەوە وەڵامی گومانەکانیان درایەوە و ڕووی ڕاستەقینەی مەدخەلیەکان دەرکەوت کە چ بەرگریکارێکی سەختی عەلمانی و دیموکراسی خوازەکانن، بەڵام عەجیب ئەوەیە ئەو ڕەوتەی کە لەژێر ناوی جیهاد-دا وەڵامی گومانی مەدخەلیەکانیان دایەوە لەو بابەتەدا ئێستا خۆیان تووشی هەمان دەرد بوون و دێن باسی هەبوونی عوزر بە تەئویل لە کوفر و شیرکی گەورە و ئاشکرادا زیندووئەکەنەوە کە هەمان ئەو بابەتەیە کە خۆیان ڕەددی مەدخەلیەکانیان دایەوە بەڵام بەشێوەیەکی تر، واتە دوو ڕووی یەک دراون لەو بابەتەدا، ئەمانیش بۆ ڕێگریکردن لە تەکفیرکردنی ئیمامە ئەشعەریە جەهمیەکانیان ئەم بابەتە ئەوروژێنن، ڕەحمەتی الله لە ابن عون کە ئەڵێ: کاتێک

هەوا و ئارەزوو زاڵ بوو بەسەر دڵدا ئەوا پیاو ئەو شتە بە باش دائەنێت کە بوغزاندبووی .

جا عوزر ئەهێننەوە بۆ کەسێک کە کوفر ئەکات بەوەی کەسەکە عالمە و خاوەنی دەیەها کتێب و شەرحە و خزمەتی بە ئیسلام کردووە و جیهادی کردووە بۆیە تەئویلی کردووە و نەپێکاوە ناکرێت لەسەر تەئویل-یش تەکفیر بکرێت، واتە ئەڵێن جاهیل کوفر بکات تەکفیر ئەکرێت بەڵام عالم کوفر بکات تەکفیر ناکرێت، جا ئەمەش هیچ نیە جگە لەو ڕێچکەیە نەبێت کە یەهود گرتبوویانە بەر لەوەی کە کەسێکی خانەدانیان کەسێکی هەژاری بکوشتایە ئەوا فیدیەی خوێنەکەی تەنها چەند صاعێک خورما بوو بەڵام ئەگەر کەسێکی هەژار کەسێکی خانەدانی بکوشتایە ئەوا فیدیەکەی کوشتنەوە بوو، جا ڕەحمەتی اللّه-ت لێ بێ بزانە هەرکەسێک خاوەنی بەصیرەت بێت ئەوا ئەزانێت کە وتەی ئەم دوو ڕەوتە لاڕێیە جگە لە شوێنکەوتنی هەوا و ئارەزوو و بەرژەوەندی خۆیان هیچی تر نیە و هیچ بەڵگەیەکیان پێ نیە بۆ بەرگریکردن لە کافران و موشریکین و ئەهلی بیدەع و گومڕایی، داواکارین لە اللّه تعالى دوای هیدایەتدانمان گومڕامان نەکات و سەرمان لێ نەشێوێنێت .

## چەند وتەیەکی کەم دەربارەی نەبوونی عوزر بە تەئویل لە کوفر و شیرکی ئاشکرادا :

١ - ئیمام **المروزي** رحمه الله ئەڵێ :

(پرسیارم لە **الإمام أحمد** (**٢٤١** ھ) کرد دەربارەی عبدالله التيمي؟

وتی : صدوق-ە، هەندێک فەرموودەم لێوە نووسی لە بابەتی الرقائق، بەڵام لێوەی ئەگێڕنەوە کە باسی فەرموودەی پێکەنینی الله-ی کردووە، وتوویەتی : هاوشێوەی درەخت کاتێک سەوز ئەبێت و ئەدرەوشێتەوە، **ئەمەش وتەی جەهمیەکانە)** .

**| الإبانة الكبرى : ١١١/٣ |**

**وتم :** نکۆڵی فەرموودەکەی نەکرد و ڕەتی نەکردەوە تەنها تەئویلی کرد کەچی پێشەوا أحمد رحمه الله تەئویلەکەی دایە پاڵ جەهمیەکان و بە کافری دانا .

٢ - **محمد بن إبراهيم الأصبهاني** رحمه الله ئەڵێ :

(بیستم پرسیار لە **أبو زرعة** (**٢٦٤** ھ) کرا دەربارەی تەفسیری | **ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ** | ؟

أبو زرعة تورە بوو وتی : چۆن ئەخوێندرێتەوە ئاوا تەفسیر ئەکرێت، الله لەسەر عەرشەکەیەتی، عیلمەکەشی لە هەموو شوێنێکە، **هەرکەسێک جگە لەوە بڵێ ئەوا لەعنەتی الله-ی لێبێت)** .

**| العلو للذهبي : ٤٦٥ |**

**وتم :** جەهمیەکان وتیان استوی واتا استولی، دەقی ئایەتەکەیان ڕەت نەکردەوە بڵێن باوەڕمان پێی نیە بەڵکو تەئویلیان کرد، ئەی ئایا ئەشعەریەکان تەئویلی ئەو ئایەتە ناکەن بەوەی الله دەستی بەسەر عەرشدا گرتووە؟! گەر لێشیان بپرسیت بۆچی وا تەئویلی ئەکەن ناڵێن بۆ پاکڕاگرتنی الله لەوەی بڵێین مەکانی هەیە؟! کەچی أبو زرعة رحمه الله وتی لەعنەتی الله لەوەی جگە لەمە ئەڵێت، ئەی بۆچی جەهمیەکان کافر بن ئەشعەریەکانیش موسڵمان بن و بکرێن بە ئیمام، لە کاتێکدا لەعنەتەکەی أبو زرعة رحمه الله هەردوولایان وەک یەک ئەگرێتەوە .

**٣** - ئیمام **الترمذي** رحمه الله (**٢٧٩** هـ) ئەڵێ :

(الله عز وجل زیاتر لە جێگایەک لە کتێبەکەی باسی دەست و بیستن و بینینی کردووە، **جا جەهمیەکان ئەم ئایەتانەیان تەئویل کرد، تەفسیریان کرد جیاواز لە تەفسیری زانایان، وە وتیان الله ئادەمی دروست نەکردووە بە دەستی، وە وتیان دەست لێرەدا و اتا هێز).**

| جامع الترمذي : ٤٣/٢ |

وتم : جەهمیەکان نەیانوت ئێمە ئایەتەکە ڕەت ئەکەینەوە و باوەڕمان پێی نیە چونکە ئەگەر وا بڵێن کەسێکی عەوامیش ئەزانێت کافرن بەڵکو قبوڵیان کرد بەڵام تەئویلیان کرد، ئەشعەریەکانیش بە هەمان تەئویلی جەهمیەکان تەئویلی صیفەتی دەستی الله تعالى ئەکەن، ئیتر بۆ ئەویان کافر بێت و ئەمیان موسڵمان و ئیمام؟! لەکاتێکدا هەردوو کۆمەڵە کافرەکە باوەڕیان بەو ئایەتانە نییە، بەڵکو ئیمانیان بەو تەحریفاتانە هەیە خۆیان ئەیکەن بۆ ئایەتەکە .

٤ - ئیمام عثمان بن سعيد الدارمي رحمه الله (٢٨٠ ه) ئەڵێ :

(پێمان گەیشتووە کە هەندێک لە هاوەڵانی بشر المريسى، بە بشر-یان وتوە: چی ئەکەیت لەم سەنەدە صەحیحانەی کە بەڵگەی پێئەهێننەوە بۆ ڕەددانەوەی مەزهەبەکەمان کە ناتوانرێ بە درۆ بخرێنەوە، وەک (سفيان عن منصور عن الزهري) و (الزهري عن سالم) و (أيوب وابن عون عن ابن سيرين) و (عمرو بن دينار عن جابر عن النبي ﷺ) وە هاوشێوەی ئەم سەنەدانە؟

**بشر المريسى وتی: ئەم سەنەدە صەحیحانە ڕەت مەکەنەوە ئابڕوتان ئەچێت، بەڵام بە تەئویل کردن بە هەڵەیاندا ببەن، جا ئەوکات بە نەرم ونیانی ڕەتتان کردۆتەوە چونکە ناتوانن ڕەتیان بکەنەوە بە توندی) .**

| نقض الدارمي على المريسي : ٦٤٧ |

وتم : بشر المريسي سەرە زلەکەی جەهمیەکان ئامۆژگاری هاوەڵە جەهمیەکانی ئەکات بەوەی هەرکات حەدیثی صەحیحیان پێگەشت دەربارەی صیفەتەکانی الله تعالی ئەوا ڕەتی نەکەنەوە، چونکە کەسێکی عەوامیش ئەزانێت ڕەتکردنەوەی حەدیث کوفرە، بۆیە پێیان ئەڵێ تەئویلی بکەن، تەئویلەکەش هەر ڕەتکردنەوەیە بەڵام بە شێوازێکی نەرم وەک خۆی ئاماژەی پێئەدا، جا ئەشعەریە جەهمیەکانیش ملیم بە ملیم شوێن ئەم وەسیەتە پڕ کوفرەی ئیمامەکەیان کەوتوون هەتا ئێستا، هەتا بتوانن تانە ئەدەن لە هەر فەرموودەیەک کە خۆیان باوەڕیان پێی نەبێت و بە کوفر و گومڕایی بزانن، پاشان ئەگەر بزانن ناتوانن تانە بدەن لە فەرموودەکە و ڕووی ڕەشیان بۆ هەرچی موسوڵمان هەیە دەرئەکەوێت ئەوە دێن تەحریفی ئەکەن .

٥ - ئیمام عثمان بن سعيد الدارمي رحمه الله (٢٨٠ ه) ئەڵێ :

(ڕووکەش و ناخی قورئان هەمووی بەڵگەیە لەسەر ئەو وەصفەی کردمان - وەصفی علوی الله تعالی - ، تەنها بە خوێندنەوەی ئایەتە دابەزیوەکان وازئەهێنین و پێویستمان بە تەفسیرکردنی نیە، وە خەڵکی عەوام و خەڵکی تایبەت ئەیزانن، **جا لەم ئایەتانەدا بۆ کەسی تەئویلکەر هیچ تەئویلێک نیە تەنها تەئویل بۆ ئەو کەسە هەیە کە ئەم ئایەتانە بە درۆ ئەزانێت لە ناخی خۆیدا بەڵام بە تەئویل کردن کارەکەی دائەپۆشێت)** .

| الرد على الجهمية : ١٠١ |

وتم : جەهمیەکان تەئویلیان کرد لە صیفەتەکانی الله تعالى بەڵام ئەم تەئویلە نەبووە ڕێگر لەوەی سەلەف رحمهم الله تەکفیریان نەکەن و ناویان نەبەن بە زەندیق و مورتەد، چونکە تەئویلی جەهمیەکان هەڵوەشێنەرەوەی تەوحیدە ئەگەرچی بەحسابی خۆشیان بۆ پاکڕاگرتنی الله تعالى کردبێتیان، وە ڕەزا و ڕەحمەتی الله تعالى لە ئیمام کە چەندە بە جوانی عەقیدە کوفریە بۆگەنەکەیان ڕەتئەکاتەوە لەم وتە ئاڵتوونیەیەدا : **(جا لەم ئایەتانەدا بۆکەسی تەئویلکەرهیچ تەئویلێک نیە تەنها تەئویل بۆئەوکەسە هەیە کە ئەم ئایەتانە بە درۆ ئەزانێت لە ناخی خۆیدا بەڵام بە تەئویل کردن کارەکەی دائەپۆشێت)**.

تەواوی ئەشعەریە جەهمیەکانیش کافرن بە ئەو ئایەت و فەرموودەیانەی کە لەڕێگەی تەحریفەوە ئەیانەوێت کوفرەکەیان بەرامبەری بشارنەوە .

٦ - ئیمام عثمان بن سعید الدارمي رحمه الله (٢٨٠ هـ) دەربارەی تەئویلی جەهمیەکان بۆ صیفەتی دەستەکانی الله تعالى کە بە نیعمەت تەئویلی ئەکەن، پاشان ئایەتی | بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ | ئەهێنێتەوە و ئەڵێ :

(ئایا ئەکرێت بوترێ یداه واتا نعمتاه؟! یداه دووانە، ئەگەر بە نیعمەت تەئویل بکرێ واتا دوو نیعمەتەکەی) .

ئینجا ئەڵێ :

**(ئەم تەئویلە مەحاڵە لە زماندا سەرەڕای ئەوەی کە کوفریشە، وە** هەروەها تەکفیریان ئەکەین بە یەکێک لە کوفرە ناسراوەکانیان ئەویش ئەوەیە کە ڕوو بیستن و بینین و عیلم و کەلام جێگیر ناکەن بۆ اللّٰه، **تەنها بە تەئویلێکی گومڕایانە نەبێت)** .

**| الرد على الجهمية : ص ١٧٤ |**

*وتم* **:** تەماشای ئەم وتە بەنرخەی ئیمام بکە، مەبەستی قسەکەی ئەوەیە ئێمە تەکفیریان ئەکەین لەبەر ئەوەی ئەو سیفەتانە بۆ اللّٰه تعالى جێگیر ناکەن ئیللا بەو تەئویل و تەحریفانە نەبێت کە خۆیان بۆی ئەکەن، واتە کافرن بە مانا و مەبەستی قورئان و فەرموودە، وە ئیماندارن بەو تەحریفە کوفریانەی خۆیان ئەیکەن بۆ ئایەت و فەرموودەکانی سیفات .

٧ - ئیمام *ابن سريج* رحمه الله (**٣٠٦** ھ) دەربارەی صیفەتەکانی اللّٰه تعالى ئەڵێ :

(تەئویلی ناکەین وەک تەئویلی موعتەزیلەکان و ئەشعەریەکان و جەهمیەکان و مولحیدەکان و موجەسیمەکان و موشەبیهەکان و کەڕامیەکان و موکەیفەکان بەڵکو قبوڵی ئەکەین بەبێ تەئویل) .

**| اجتماع الجيوش الإسلامية : ص ٢٥٩ |**

وتم : ئەوپەڕی گەمژەییە هێشتا بوترێت ئەشعەری و جەهمیەکان جیاوازن، یان ئەبێت بڵێیت هەردووکیان کافرن مادام تەئویلیان کردووە، یان ئەبێت بڵێیت جەهمیەکانیش وەک ئەشعەریەکان لامان موسڵمانن و ئیمامن کە هەرگیز غیرەتی ئەوەتان نیە وا بڵێن .

٨ - ئیمام البربهاري رحمه الله (**٣٢٩** هـ) ئەڵێ :

(بزانە کە دەرچوون لە رێگای ڕاست بە دوو شێوەیە :

یەکێکیان کەسێکە لائەدات لە ڕێگای ڕاست، وە نیەتی هیچ نیە تەنها خێر نەبێت، جا شوێنی لادانەکەی ناکەوین چونکە تیا چووە .

ئەوی تریان نکۆڵی حەق ئەکات و پێچەوانەی تەقوادارانی پێش خۆی ئەکات، ئەم کەسە گومرا و گومڕاکەرە، شەیتانێکی یاخیە لە الله لەم ئوممەتە، **پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە ئەیناسێت خەڵکی لێ ئاگادار بکاتەوە، وە بەسەرهاتی ئەو بۆ خەڵکی باس بکات، بۆ ئەوەی هیچ کەسێک نەکەوێتە ناو بیدعەکەی و تیابچێت)** .

**| شرح السنة : ٩ |**

وتم : جۆری یەکەم کەسێکە لە حەق لائەدات تەنها نیەتیشی خێرە، ئایا هەر یەک لەو تاقم و گروپە کافرانە لێیان بپرسیت بۆ ئەو کوفرە ئەکەیت ناڵێن

نیەتی ئێمە تەنها بۆ خێرە و بۆ چاکەیە؟! بگرە زۆرجار ئەگەر بێتو تۆش وەک ئەوان نەکەیت بە کەمتەرخەمت دائەنێن .

وە ئێمەش کاتێک کوفری سەرانی ئەشعەریە جەهمیەکان ڕوون ئەکەینەوە دەستمان گرتووە بەم وەسیەتەی ئیمام البربهاري رحمه الله .

**٩** - ئیمام ابن بطة رحمه الله (**٣٨٧** هـ) ئەڵێ :

**(کاتێك ئیقامە حوججە کرا لەسەر کەسی جەهمی، وە صەحیحی فەرموودەکانی صیفەتەکانی الله-ی زانی، وە نەیتوانی نکوڵی لێ بکات، ئەڵێ : فەرموودەکە صەحیحە، بەڵام مانای وتەی پێغەمبەر ﷺ (پەروەردگارمان هەموو شەوێک دائەبەزێت) واتا : فەرمانی الله دائەبەزێت .**

وتمان : بەڵکو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (الله عز وجل دائەبەزێت) و (پەروەردگارمان دائەبەزێت) گەر مەبەستی فەرمانی الله بووایە ئەیفەرموو : (فەرمانی پەروەردگارمان دائەبەزێت) .

**| الإبانة الكبرى : ٢٧٦٦ |**

وتم : تەماشا بکە رحمک الله هەموو کەسێکی خاوەن ژیری و دڵێکی زیندوو لەم وتەیەی ئیمام زۆر بە باشی تێئەگات، کاتێک جەهمیەکان نەیانتوانی تانە لە فەرموودەیەک بدەن لەڕووی صحة ـەوە، ئەوە دێن مانای فەرموودەکە

ئەگۆڕن، چونکە ئەمانە هەر کافرن بە فەرموودەکە، بە هەر جۆرێک بێت ڕەتی ئەکەنەوە و باوەڕی پێ ناکەن .

١٠ - ابن القيم (٧٥١ هـ) ئەڵێ :

(مەبەستی سەلەف ئەوە نیە هەرکەسێک نکۆڵی لەفزی قورئان بکات ئەبێتە جەهمیەکی بیدعەچی و کافرێکی زەندیق، **بەڵکو مەبەستی سەلەف ئەوەیە ئەوەی نکۆڵی مانا و حەقیقەتی لەفزەکە بکات)** .

| اجتماع الجيوش الإسلامية : ص ٣٣٣ |

وتم : تا ئێستا بینیوتە ئەشعەریەک نکۆڵی ئایەتێک بکات دەربارەی صیفەتێکی الله تعالی و بڵێت بڕوام بەم ئایەتە نیە؟ یان ئەڵێت بڕوام پێی هەیە بەڵام ماناکەی ئەوە نیە و خێرا ڕائەکات بەرەو تەئویلی باوانە جەهمیەکانی لەسەر ئایەتەکە کە سەلەف تەکفیریان کردبوون لەسەر ئەو تەئویلاتە .

١١ - ابن القيم (٧٥١ هـ) ئەڵێ :

**(گەردان بنێت بە لەفزەکەی بەڵام نکۆڵی ماناکەی بکات یان تەحریفی بکات بۆ مانای ترجگە لەو مانایەی مەبەستە ئەوا باوەڕی پێی نیە بەڵکو لە بەدرۆ دانان نزیکترە)** .

| الصواعق المرسلة : ١٠٤٦/٣ |

وتم : تەئویل کردنی دەقێکی قورئان یان حەدیثی یەکسان کرد بە بەدرۆخستنەوەی دەقەکە .

١٢ - ابن القيم (٧٥١ هـ) ئەڵێ :

**(جەهمیەکان لە تەحریف کردنی ئەو دەقانەی کە هاتوون دەربارەی صیفات رێبازی براکانیان گرتە بەر لە یەهود، کاتێک نەیانتوانی تەحریفی دەقەکانی قورئان بکەن تەحریفی ماناکانیان کرد و دەستیان کرد بە تەئویل کردن و دەرگای تەئویلیان بۆ هەموو مولحیدێک کردەوە کە دژایەتی دین بکات).**

| الصواعق المرسلة : ٢١٦/١ |

١٣ - ابن رجب (٧٩٥ هـ) ئەڵێ :

(سەلەف **تەئویلی** ئەم ئایەت و فەرموودە صەحیحانە ئەدەنە پاڵ جەهمیەکان) .

| فتح الباري : ٩٧/٥ |

وتم : هەر تەئویل نەبوو وای کرد جەهمیەکان تەکفیر بکرێن لەلایەن سەلەفەوە؟! ئەی ئێستاش هەر ئەو تەئویلاتە نیە کە ئەشعەریەکان دەستیان

پێوه گرتووه؟ ئیتر بۆ جەهمیەکان کافر بن و ئەشعەریەکان موسڵمان بن نەک موسڵمان بگره ئیمامیش بن!

١٤ - عبدالرحمن بن حسن آل الشيخ (١٢٨٥ هـ) ئەڵێ :

**(هەرکەسێک نکۆڵی شتێک لەوانە بکات کە الله وەصفی خۆی پێکردووە یان پێغەمبەرەکەی وەصفی پێکردووە یان تەئویلی بکات بە پێچەوانەی ڕووکەشی ماناکەی، ئەوا ئەم کەسە جەهمیە، شوێنی ڕێبازی غەیری ئیمانداران کەوتووە، هەروەک الله تعالى فەرموویەتی :** | **وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا** | **(النساء : ١١٥)**

**| فتح المجيد : ص ٧٤٣ |**

١٥ - عبداللطيف بن عبدالرحمن بن حسن (١٢٩٣ هـ) ئەڵێ :

(لە ئەهلی بیدعەکان کافترینیان **جەهمیەکانن**، ئەوانەی کە نکۆڵی صیفەتەکانی الله ئەکەن کە لە قورئان و سوننەتدا هاتوون، وە **تەئویلیان ئەکەن**) .

**| عيون الرسائل والآجوبة على المسائل : ٧٩٥/٢ |**

١٦ - سلیمان بن سحمان بە نقڵ کردن لە شێخەکەی واتە عبداللطیف بن عبدالرحمن کە ڕەددی داود بن جرجیس ئەداتەوە، ئەڵێ :

(سەرجەمی کافران و موشریکان لە سەردەمی نوح هەتاکو سەردەمی ئێمە نەزان بوون، وە **تەئویلیان کردووە**، وە ئەهلی حلول و ئیتیحاد وەک ابن عربي و ابن الفارض و التلمساني و بێجگە لەوانیش لە صۆفیەکان **تەئویلیان کردووە**، وە قەبر پەرستە موشریکەکانیش ئەوانەی جێگەی مشتومڕن **تەئویلیان کردووە** وە ئەڵێن ناتوانن بچنە لای پاشای گەورە ئیللا لەڕێگەی واسطەیەکەوە نەبێت، وە نەساڕاش **تەئویلیان کردووە** لەو بوهتانە گەورە و شیرکە نالەبەرەیان).

| منهاج التأسيس : ص ٢٦٢ |

وتم : قەومی نوح کاتێک دەستیان دایە پەرستنی پیاوچاکەکانیان تەئویلیان هەبوو تەئویلەکەشیان ئەوە بوو کە ئەمانە دەنگی ئێمە ئەگەیەنن بە الله بۆیە ئەیانپەرستین، وە قەبرپەرستەکانیش کاتێک هاوارئەکەن لە شێخێک یان گۆڕێک ئەڵێن ئەو کەسە پیاو باشە و پلەی تایبەتە لای الله بۆیە داوای لێ ئەکەین لای الله داوامان بۆ بکات .

واتە ڕاستە هەموو کۆمەڵەیەک کە لا ئەدات لە حەقێکی ئاشکرا تەئویلێکی بەدەستەوەیە، بەڵام ئەم تەئویلە نابێت بە هۆکارێک بۆ عوزر دان پێی و بە کافر نەزانینی .